# بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

## پێشەکی

ئەم نامیلکەیە پێک هاتوە لە چەند بابەتێک کە ناوەڕۆکی بابەتەکان بۆ خۆ ڕاگری و بەهێز بوون لە بەردەم ،کێشە و ناخۆشی و بەربەستەکانی ژیان دانراون ،هەموو مرۆڤێک توانای هەیە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی بەربەستەکان بەڵام مەرج ئەوەیە تۆ ئەو توانایەت بخەیتە گەڕ و ڕووبەڕوی ببیەوە وە لەم نامیلکەیە باسی ژیانی دوو ئەکتەری کۆمیدی کراوە ئەمەش بە مەبەستی تێگەیشتن لەوەی کە سەرکەوتن و خۆ بە جیهان ناساندن بەیەک هەنگاو نابیت بەڵکو بەچەند هەنگاوێک تا دەگەی بەوەی دەتەوێت سەرکەوە تۆ شایەنی سەرکەوتنی.

## ناوەڕۆک

# هەرگیز هەموو ڕێگایەکە نابینی

**یەکیک لە هوکارە سەرەکیەکانی ساردبوونەوەی ئیمە لە پڕۆژەی هەوڵدان بۆ گەشتن بە خەون و ئامانجەکانمان بریتیە لەوەی کە پێمان وایە ئەبێ ڕێگاکە بە کامڵی ببینین دڵنیابین دوای هەنگاوی یەکەم دووەم چیە سێیەم چیە چوارەم چیە ئەمانەوێ وەک و چۆن لە بەرگی کتێبەکە کە لە سەرەتاوە نوسراوە بەشی یەکەم بەشی دووەم....چی لێ ئەخوێنیتەوە چی لێ فێردەبی بە هەمان شێوە ئەمانەوێ پڕۆسەی گەیشتن بە خەون و ئامانجەکانمان بەو شێوازەبێ کە ئەمە هەرگیز لە واقعی انسان رروونادات بیهێنە لێش چاوی خۆت**

**لە شەوێکدایت لایتی سەیارەکەت داگیرساندووە و رووە و مالەوە ئەگەڕێیتەوە ماڵەکەت ئامانجە گەورەکەتە لە ژیان ئامانجەکەت وجودی هەیە ماڵەکەت وجودی هەیە وە لە شەوایت و تاریکە ڕێگاکەت لایتەکەت داگیرساندووە لایتەکە هەموو جادەکە ڕووناک ناکاتەوە تەنها پێشی خۆتت بۆ ڕوناک دەکاتەوە کە لەو کاتەدا تۆ پێویستتە گرنگە لەمڕۆماندا لە بەیانیدا بژین بای ئەوەندەی ڕوناکیمان هەیە هەنگاو بنێین تاوەکو هەنگاو بە هەنگاو کیلو مەتر بە کیلۆ مەتر لە ماڵە گەورەکەو ئامانجە گەورەکەمان نزیک ببینەوە بە ئومێدی گەیشتن**



## کێ دەتوانێ تونێلەکە ببڕێت؟

**ئەو شتەی کە تۆدەهێلێتەوە لەژیان تۆ ئەزانی زۆر زۆر ئاسایە هەندێک جار لە ژیاندا بە ئەزمونی سەخت دا بڕۆین**

**ئازار دەدەین،بێزار دەبین،خۆمان ون دەکەین،قەلەق دەبین.....نازانین لە کوێوە ڕوناکیەک نازانین چۆن،کەی،ڕزگارمان دەبێت لەم تاریکیە من پێشنیاری شتێکت بۆ دەکەم گەر کەوتیتە بارودۆخێکی هاوشێوە هەموو کات وەکو ئەوە بێنە پێش چاوی خۆتەوە وەکو تێپەڕین وایە بە ناو تونێلەکەدا بەردەوامی تاکە ڕێگایە بۆ دەرباز بون ،بەردەوام بە لەڕۆیشتنی خۆت**

**چونکە هیچ کەسێک نەیتوانیوە بگاتە ئەو سەری ڕوناکی تونێلەکە کە لە ناوەڕاستی تونێەکە دەست بەدار بوبێ**

## بەهێزبە و ڕووبەڕووی ببەوە

**تا زیاتر لە کێشەکانی ژیانت ڕا بکەیت، زیاتر دێتە سەرت. باشتر وایە ڕووبەڕووی ئەوە ببینەوە کە بەهێز بمێنیتەوە**

**خەڵکێکی بەهێز دەزانن کە ئازار چییە چونکە ئەوان چەندین جار لەو شتانەی کە تۆ لە ژیاندا پێیدا تێپەڕیویت.**

**ئەو کەسانەی کە دەزانن چۆن لە ژیاندا ڕزگاریان ببێت ئەوان بەهێزن. لە هەموو ئەو جیهانە**

**بیرکردنەوەی ئەرێنی لەوانەیە یارمەتیت بدات بۆ زاڵبوون بەسەر هەر بەربەستێکدا. بە هێز بمێنەوە و بەردەوام بە لە شەڕکردن بۆ خۆشبەختی خۆت!**

**ژیان دەتوانێت کەمێک سەخت بێت بەڵام هەرگیز هیوا لە دەست نادا. بە هێز بمێنەوە و خۆڕاگری بکە. پاداشتەکە زۆر باشترە.**

**تۆ ناتوانیت هیچ شتێک لە ژیاندا بگۆڕیت ئەگەر لە ڕێگەیەوە کار نەکەیت. بۆ گۆڕینی تۆ پێویستە بەهێز بیت.**

**تۆ پێویست ناکات لە ژیاندا هیچ کارێک بکەیت. ئەگەر تۆ سەرت بەرز بێت و بە کەسایەتیەکی بەهێزەوە سەرت هەڵبگرێت لە کۆتاییدا لە تۆ دەترسێت.**

## بەهێزی خۆم و هاوڕێیەکەم

تۆ دەبێت بەهێز و گەشبین و ئازا و بوێر و ڕاستەقینە بمێنیتەوە بۆ خۆت، هاوڕێکەم.

من باوەڕم وایە تۆ هێزی ئەوەت هەیە کە ئەم دۆخە سەختە داگیر بکەیت، هاوڕێ بە هێز و ئەرێنی بمێنەوە تۆ هەمیشە ئەو هاوڕێیەی کە فێری کردووین گەشبین بمێنینەوە و هێزمان لە هەموو کات و زەمانە سەختەکانماندا بهێڵینەوە، بۆیە من تەنیا داواتان لێدەکەم کە چیتان پراکتیزە بکەین

تۆ مافی ئەوەت هەیە کە بگریت و هاوار بکەیت، هاوڕێکەم. بەڵام بیرتان بێت کە بە هێز بێنەوە و بەرەنگاری خۆتان بکەن.

تۆ کەسێکی لاواز نیت. لە ڕاستیدا تۆ بەهێزترین هاوڕێت کە تا ئێستا هەیبووم. تۆ شەرڤانی کەواتە بەهێز بن و هەموو زەحمەتەکانتان بجەنگن.

من باوەڕم وایە کە دەتوانیت هێزی خۆت بهێڵیتەوە و زاڵ بیت بەسەر هەموو زەحمەتێک لە ژیانتدا. تکایە بەهێز بن.

ئەوە توانای تۆیە کە لە کاتی سەختدا ئەرێنی بمێنیتەوە بۆ ئەوەی تۆ بە بەهێزترین کەس بکەیت!



## بزانە کەسانی سەرکەوتوو بۆچی دەتوانن هەلەکان بەسەرکەوتوویی بقۆزنەوە؟

هەمیشە لە بیرتبێ یەکێک لە تایبەتمەندیە گەورەکانی کەسانی سەرکەوتوو لە ژیاندا ئەوانەی کە ئەگەن بە ئامانجەکانیان ئەوەیە کە هەمیشە لە ئامادە باشی بەردەوامدان چاوەڕێ ناکەن تاوەکو چانسەکان دێنە بەردەمیان ئینجا دەست بکەن بە ئامادەکاری بەڵکوو بەردەوام لە ناوچەی دەرەوەی ئاسودەیی خۆیانن گەشەدەکەن،فێردەبن ،بەرەوپێشەڕۆن،پرسیاردەکەن ،بەدوای کەسانێکەوەن کە لە خۆیان بەتواناترە تەرکیز دەخەنە سەر تواناکانی خۆیان هەوڵدەدەن،دانانیشن لە ژوورەوە لەگەڵ بازنەی ئاسودەیی خۆیانەوە چاوەرێ بکەن ڕۆژێک لە ڕۆژان چانسێک بێتە بەردەمیان بۆ ئەوەی کە دەست بکەن بە ئامادەکاری من هەموو کات ئەوەم وەک و نموونەی ئەوە هێناوەتەوە مونتەخەبێک یانەیەکی دوو گۆڵی یان هەر یاریەکی وەرزشی دیکە هێناوەتەوە کە کاتێک تۆ ئامادەکاری دەکەیت کە یاریەکە دەستی پێ نەکردووە کە دەستی پێکرد ئیتر تۆ دەست بکەی بە ئامادەکاری بەدڵنیاییەوە دەدۆڕێی چونکە ڕۆژی یاریەکە ڕۆژی خۆ ئامادەکاری نیە ،ڕۆژی ڕاهێنان کردن نیە یاخوود تیمێکی سەربازی وڵاتێک لەو کاتەدا خۆی بەهێز دەکا کە وڵاتەکەی لە ئاشتی دایە چونکە تۆ خۆت ئامادەدەکەی بۆ ڕۆژێک گەر هاتوو شەردروست بوو بۆ ئەوەی تۆ ئامادەبی ئەم شانسە لە دەست نەدەی هەلەکە لە دەست نەدەی وڵاتەکە نەڕوخێ لەسەر ئەوەی کە تۆ ئامادە نەبووی.



## ئامادە باشی بکە

لە تیمی سەربازی وڵاتێک تەسەوڕ بکەن وا بیربکاتەوە بڵێ ئیشاللە کە شەڕەکە بوو خۆمان ئامادە دەکاین ئەو کاتە دەست دەکەین بە تەمرینێکی عەسکەری بەقوەت نا هیچ وڵاتێک بەم شێوازە بیر ناکاتەوە گەر وا بیر بکاتەوە ئەوا بە دڵنیاییەوە هێزێکی سەربازی دۆڕاوی هەیە یاخود هیچ یانەیەکی وەرزشی بەمشێوازە بیرناکاتەوە بڵێ ئیشاللە تەمرینەکەمان هەڵدەگرین بۆ ڕۆژی یاریەکە ئەی بۆ ئێمە لە ژیانماندا وابیردەکەینەوە

وە زۆر جار ئێمە یاریکردنێک یاخود خۆ ئامادەکردنێک هەڵدەگرین بۆ ئەوکاتەی کە یاریەکە دەست پێدەکات هەڵەیە لە ژیان سەرکەوتوو نابی بەمشێوازە پێویست دەکا هەموو ڕۆژ لە ئامادەباشی دابی کاتێ هەموو ڕۆژێ لە ئامادە باشی دابووی هەمووکات لە ناوچەی دەرەوەی ئاسودەیی خۆت بووی بەردەوام ئامادەی هەر هەلێک هاتە پێشەوە چەنێک گەورەتریش بێت ئەم هەلە تۆ دەتوانی بە دەستی بێنی بە حوکمی ئەوەی گەورەی بە حوکمی ئەوەی بەرەو وێش چووی

## شکست! پێچەوانەی سەرکەوتن نیە بەڵکو بەشێکە لە سەرکەوتن

**کە دەڵێین بەهێز بمێنەوە واتا ڕووبەرووی  هەموو شتێک ببەوە ڕووبەڕووی ئەوە ببەوە کە دەیەوێ بتوەستێنێ و دژی سەرکەوتنی تۆیە  ژیان وا دەگوزەرێ کە  تێدا تووشی هەزار شت دەبیت  ناخۆشیەک یان کێشەک یان شکستی یەکەم ناتوانێ چۆک بەتۆ دابدا کە توشی ناخۆشیەک بووی  بڵێ من**

**بەهێزم زاڵ دەبم بەسەری و من زۆر بەهێزترم لەو کێشەیە سەبر بگرە خودا لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت (ان الله مع الصابرين) واتا خودا لەگەڵ ئەو کەسانیە کە سەبریان هەیە تۆ جوزانی لەوانەیە خودا لۆ ئەوەی بزانێ تا چەند سەبرت هەیە تا چەند بەرگە دەگری بۆیە ئەو کێشەت لۆ دەنێری دە تۆش بە ڕوێکی خۆش و بێ کۆڵدانەدان و بە بەهێزی خۆت بسەڵمێنە بڵێ  خودایە بەندەکەت بەهێزترە لەو کێشانە ژیان خۆشی و ناخۆشی تێدایە مەڵێ من چۆن بە بەهێزی بمێنمەوە چی کێشە هەیە ئەمن هەیتم نا ئازیزم بەس تۆ نیت بەس تۆ ئاوا نیت خودا بەڵێنێکی داوە کە دەفەرمویت دوای هەموو ناخۆشیەک خۆشیەک دێت کەواتە بۆ بی هێز دەبی بۆچی کۆڵدەدەی بە قسەی کێ بە قسەی بەندەیەکی بێدەستهەڵاتی پەروەردگار ؟ نەخێر هەرگیز سارد مەبەوە و کۆڵمەدە لەوەی کە دەتەوێ سەرکەوتن چاوەڕێتە تەنیا بانگی تۆ دەکا تۆش پێویستت بە چەند هەوڵدانێک هەیە تا بگەی بە سەرکەوتن  هەندێک کەس هەیە کە لە کارێک دا یەکەم جار شکست دێنێت دواتر دەڵێت تەواو شکستم هێنا واز دێنێ نا نەکەی واز بێنێ  ئێ خۆ هەتا نەکەوی هەڵناستێوە ئێستا تۆ هەتا نەکەویە سەر زەوی هەڵدەستێوە ؟  نەخیر  کەواتە ژیان وایە کەوتنە و سەرکەوتنە  گرینگ کۆڵنەدانە  ئەو کاتەی کە تۆ بڕیارت دا بە بەهێزی بمێنێوە و بەردەوام بی ئەو کاتە سەرکەوتن دەتبینێت و بانگت دەکات**

## نهێنی سەرکەوتن!

**بۆ ئەوەی سەرکەوتوبی پێویستە بدۆڕێیت! تا بزانی جاری دوای ئەو چی بکەیت،**

**گەشتێکی هەزار کیلۆمەتری بە یەکەم هەنگاو دەست پێدەکات**

**تاکە کەسێک کە هەرگیز سەرناکەوێت ئەو کەسە یە کە هیچ هەوڵێک نادات**

**سەرکەوتن گەشتی هەموو ژیانتە نەک گەیشتن بە خاڵێک**

**من ناتوانم هاوکێشەی سەرکەوتنت پێ بلێم بەڵام دەتوانم هاوکێشەی دۆرانت پێ بڵێم**

**ئەویش ئەوەیە کە هەموو کەسێک ڕازی بکەیت**



**گەورە ترین سەرکەوتن زاڵ بوونە بەسەر نەفس و ئارەزووەکانی خۆتدا!!**

## خەونەکەت بەدەست بهێنە!

**تۆ ناتوانیت جەنگەکە ببەیتەوە بەرامبەر ژیانت ،ئەگەر تۆ نەتوانیت جەنگەکە ببەیتەوە بەرامبەر بە مێشکی خۆت،**

**دەریاوانەکان وتەیەکیان هەیە کە دەڵێن:هەموو کەس دەیەوێت بچێتە بەهەشتەوە بەڵام کەس نایەوێت بمرێت**

**من دەتوانم قسەت بۆ بکەم دەربارەی تۆ دیارە هەروەک دەزانی تەنها یەک (تـۆ)هەیە،**

**ئەگەر لە مێژوی مرۆڤایەتیدا قسە بۆ کۆمەڵێکی پێنج ساڵان بکەیت هەروەها**

**پێیان بڵێیت:ئایا ئێوە دەتانەوێت چی بکەن لە ژیانتاندا؟**

**دەزانی کە :ئەوان خەونی گەورەیان هەیە دەیانەوێت ببنە فڕۆکەوان،دەیانەوێت ببنە پزیشک،دەیانەوێت ببنە وەرزش کارێکی ئەستێرەیی،دەیانەوێت ببنە کەشتیوانی ئاسمانی ،**

**دەیانەوێت شتێکی گەورە ئەنجام بدەن،**

**بەڵام دواتر!شتێک ڕودەدات کە گەورە دەبن ،هەروەها دواتریش دەردەچن لە**

**"ژیانە ڕاستیەکە" هەروەها شتێکیان بۆ پەیدا دەبێت بە ناوی "سەرۆک"**

**هەروەها یاخود کارێک بەدەست دەهێنن تەنها کارێک هەروەها دەست دەکەن بە شەکەت بون لە کارەکانیان دا ژیان دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئەو خەونانە**

**هەروەها دەست دەکات بە مانەوە ئەوان دەست بەرداری خەونەکانیان دەبن**

**هەروەها تانها دەست دەکەن بە ڕازی بونی ئەو ژیانە بەڵام تۆ پێویستە نیشانیان بدەیت**

**هەروەها شێتانە بجەنگیت بجەنگە وەک دڕندەیەکی ناو دارستان بۆ خەونەکەت هەروەها بۆ ژیانت تۆ دەخوازیەکت هەیە کە بریتیە لە: سەرکەووتن هەروەها دڵخۆشی بۆ خێزانەکەت ژیان ئەوەت پێدەدات کە خۆت ڕازی دەبیت پێی**

**ئەگەر تۆ ژیانێکی وەک هەبونی مانگێکی زۆر لە کۆتای پارەدا ڕازیبیت**

**هەروەها بەکار هێنانی بەڕێز مستەر کارت بۆ پارەدان بە بەڕێز ڤیزە**

**ئەوان ژیان هەر ئەوەت پێدەدات کە پێی ڕازیت تۆ پێویستە داخوازی ئەوە بکەیت**

**تۆ پێوەستە ببیتە جەنگاوەر باشترین ژیان بژی هێرش بکە سەر ژیان چێژ لە گەشتەکەت وەرگرە ئێستا دەست پێبکە لە ئەمڕۆوە بۆ ڕۆژانی دواتر**

**بگۆڕێ و وزەت هەبێت هەستەو ئەمە جێبەجێ بکە هەموو ڕۆژێک لە خەو هەڵبستەو بژی فێرببە خۆشەویستی دەرببرە هەرواها پێبکەنە هەروەها بڕۆ دەرەوە و هەوڵبدە بەدەستی بهێنیت چارەنوست دیاری بکە هەروەها ئەو ژیانە بژی کە شایەنتە**

**من تۆ دەبینم لە بەرزترین پلە چونکە نزمترین پلە بە دڵنیایەوە قەڵەباڵخە .**



**کەسێ هیوا و ئاواتی نەبێ ئەوا لە پێشینەدا دۆڕاوە**

## ئەبێت بوێریت هەبێت

ئایا تۆ بوێریت هەیە؟

تاکو بەو شێوەیە هەنگاو بنێیت کە لە ناخت دایە، یان لەگەڵ خەونەکانت ئەمریت،

ئایە لەسەر لێواری ئەوە دەمێنیەوە کە دەتگوت:دەیکەم و دەتوانم هەر نەشت کرد

ئایا تۆ بوێریت هەیە؟

ئەزانی پێویستە بوێربیت تاکو سەرکەوتوبی ،ئەوەش زۆر ئاسانە تاکو سەرکەوتوو نەبی

خەم و پەژارە دایم هاوڕێتە سەرکەوتن ڕقی لە شکستەکانە ،

ئەگەر تۆ زیاتر ئەترسیت لە خەڵک وەک لە خودایەکەت ،ئەوا ئەوان بکە بە پێشەوایەکانت

وەک ئەوان رەفتار بکە وەک ئەوان جل بپۆشە وەک ئەوان هەڵسوکەوت بکە واک ئەوان بیربکەرەوە و لەپاشان بۆت دەرەکەوێت کە تۆ بوێریت نەماوە

ئەوە بوێریە وێت تا جیاواز بی ئەوە بوێریە وێت بچیتە شوێنێک کە پێشتر نەچوبی

ئەوە بوێریەوێت تاکو بەسەر کۆسپەکان زاڵبیت ئەوە بوێریە وێت تاکو ببی بە براوە ئایا بوێری ئەوەت هەیە لەپێش هەزاران خەلک بڵێیت من زۆرم چەشت و بووم بە براوە

بوێر بەو بەدوای خەونەکەت بکەوە گوێ بەخەڵکی مەدە، کە تۆ براوە بویت ئەوان خۆزگە بە شوێنەکەت ئەخوازن بۆیە تکایە بوێربە.

# بەهێز بە شەرمەزار مەبە!

سەردەکەوم چونکە شایەنی سەرکەوتنم ئەوە بخە مێشکتەوە لە کاتی بێ ئومێدی یا هەر لە مێشکت بێت تۆ بێ هێز نی تەنیا لەوانەیە ئەو کێشەی کە هەتە گەورە بێت یا گەورە بێت چاک دەبێت تێدەپەڕێت بەڵام چۆن ؟

ئەو کاتە تێدەپەڕێت کە تۆ بڕیارد دا بە بەهێزی ڕووبەرووی ببیتەوە و سەرکەوتن لە پێش خۆت ببینی باشە ئێمە بۆچی هەوڵ دەدەین یان تێدەکۆشین یان خۆمان ماندوو دەکەین ؟

بەڵێ ئەو کارانە دەکەین بۆ ئەوەی ژیان نەتوانێ چۆکمان پێ دا بدا بۆ ئەوەی بە بەهێزی ڕووبەڕووی هەموو کارە سەختەکان ببینەوە

## ئەو شتەی کە دەتوانی تێیدا سەرکەوتوبی بیکە!

ئەوە مەرگ نیە کە خەلکی لێی دەترسن بەڵکوو خەلکی ترسی خەلکی گەیشتنە بە کۆتایی ژیانیان ، چونکە بۆیان دەرەکەوێت کە هیچ کات بە ڕاستی نەژیاون

لە یەکێک لە نەخۆشخانەکاندا لێکۆلینەوەیەک کرا لەسەر کەسی ١٠٠ بەتەمەن کەسانێک کە لەنزیک مەرگ دابوون پرسیاریان لێکراوە کەلە چ شتێکی ژیانیان پەشیمانن زۆربەیان وتویانە کە پەشیمانی ئەوەنین کە کردویانە بەڵکوو پەشیمانی ئەوەن کە نەیان کردوە!

ئەوە ئەو شتانەی کە بەدیان نەهێناون ،

ژیان تەنها ئیش کردن و چاوەڕێ کردنی کۆتای هەفتە نیە و کرێی خانو نیە ،

لەوە دڵنیام کە هەموو کەسێک لەم ژیانە بەهرەیەکی هەیە خەڵک خەونەکان هەڵنابژێرن

بەڵکوو خەونەکان ئەوان هەڵدەبژێرن

وە زۆربەی خەڵکی لە فرۆکەکان ئەترسن کە لە ئاسمانن بەڵام فرۆکەکان زۆر زۆر لەسەر ئەم زەویە مەترسی دار ترن چونکە فرۆکەکان لەسەر زەوی ژەنگ هەڵدێنن ئیشناکەن و

خراپ ئەبن بۆیە فرۆکەکان وا دروست کراون کە لە ئاسمان بن

وە مرۆڤەکان بۆئەوە دروستکراون تاکو لە ناو ئەو خەونە بژی کە هەیەتی ئێمە لە دز ئەترسین کە بێ هەموو شتمان لێ ببات بەڵام دزێک لە مێشکمان هەیە ئەویش ناوی گومانە!

بۆیە ئەو گومانە فڕێدە تاکوو چەق بەستوو نەبی و بۆ پێشەوە هەنگاو بنێی و بەدەستی بێن

# نه ترسان له مردن

ژیان یان ژیانکردن بریتیه له شتێکی کاتی (دەمامکاری) هەمووومان کە دەژین جا لە هەر شوێنێک بێت مردنێک هەیە کە چاوەڕێمان دەکا و هەمووومان دەمرین و دەگەڕێینەوە لای ئەو زاتەی کە دروستی کردووین بۆیە مەترسێ لە مردن بترسە لە وەی دووای مردن شوێنت کوێ دەبێت ئەو ژیانە تەنیا تاقیکردنەوەکە و هیچی تر نا هەوڵ دە لەو تاقیکردنەوە سەرکەویت چۆن خۆت بۆ تاقیکردنەوەکی قوتابخانە ئەمادە دەکەیت دەخوینیت هەوڵدەدەیت ماندوو دەبیت تا نمرەکی بەرز بە دەست بنیت دەزانی جیاوازی نێوان ژیان و قوتابخانە چیە ؟ لە قوتابخانە فێر دەبیت جا تاقیکردنەوە دەکەیت بەڵام لە ژیاندا تاقی دەکرێوە جا فێر دەبیت بۆیە وا بکە کە ژیان تاقیت دەکاتەوە تۆ دەرسەکانت هەموو خوێندبێت لە ژیانی دوونیا چی باشە بکە چی حەڕامە لێی دوور کەوە جا لەمردن مەترسێ چونکە خودایەکت هەیە تا لەگەڵی بی وەک پشت و پەنا دەبیت بۆت لەکاتە سەختەکان لە ڕۆژە تاریکەکان لەگەڵت دەبێت بەڵام کە تۆ لە ژیاندا چی خراپە کردت ئەو شتانەت کرد کە خودا پێی ناخۆشە و دژی ئەو وەستایەوە ئەو کات لە مردن بترسە .!!!!! دەبێت باوڕت هەبێت کە هەمووومان دەگەڕێنەوە لای خودا هەمووومان بە دیداری شاد دەبینەوە بۆیە مەترسە ئێمە بەهێزترین کەسمان لەلایە کە یەکەو نابێتە دوو ئەو خودایەی کە بەدیهێنەری چ شتی جوانە لەسەر ئەو دونیایەیە ئاسمان ، زەوی ، زەریاودەریاکان ، ..............
لەو کەسە بێ ئومێد دەبی ؟ نەخێر بێ ئومێد مەبە لەوەی کە دەڵێی تاوانم زۆرە خودا لێم خۆش نابێت و بۆیە دەترسم لە مردن نەخێر خودا تا ئاخیر هەناسەش تۆبەکەت وەردەگرێت هیچ کات درەنگ نیە ئەو چاوەڕێتە خودا زۆرر لێبوردەیە بە ڕادەیەک کە لە کەسێک خۆش بوو سەرەڕای ئەوەی تاوانی زۆرر بوو تەنیا لەبەر ئەوە لێی خوش بوو کە ئاوی بە سەگێکی تینوو دابوو بۆ تۆش درەنگ نیە هیچ کات ،پشت بە خودا ببەستەو لە مردن مەترسێ

ترسان لە مردن بۆ تۆ نیە بۆ ئەو کەسانە نیە کە خودا دەناسن



## مستەر بین

یەکێک لە زیرەکترینەکانی جیهان خاوەن ڕوخسارێکی سادە و جوڵەیەکی کەم ڕەفتار کردن وەک منداڵێک و کەسێکی گێل مستەر بین ئەو ئەکتەرە کۆمیدیەیی رۆح سوکەی بە کەمتری دەربرین جیهانی هێناوەتە پێکەنین، بین هەموانی متمانە پێکرد کە کەسێکی گێلە بەڵام لە ڕاستی دا ئەو کەسێکی بلیمەتە (ڕوان ئەکتینسۆن) لە ساڵی١٩٥٥ لە ناوچەی (دورهام) لە بەریتانیا لە خێزانێکی هەژار لە دایک بووە باوکی جوتیار بوە لە قۆناغەکانی ئامادەیی تواناکانی لە زانست و ماتماتیک دەرکەوتن لە خوێندنگادا هاوڕێی تۆنی بێر سەرۆک وەزیرانی پێشوی بەریتانیا بوە ئەندازیاری کارەبای لە زانکۆیەکانی (ئۆکسفۆرد) و

(نیو کاسڵ) تەواو کرد بڕوانامەی ماستەری لە سیستەمی دان بەخۆداگرتن بەدەست هێنا

ڕوان ئەکتینۆس بەنیاز بوو بڕوانامەی دکتۆراش بەدەست بێنێت بەڵام هونەر سەرقالی کرد هەمو حەزەکانی بۆ لای ئەو چوو سەرەتای کارە هونەریەکانی بە شانۆگەریەک دەست پێ کرد کاتێک لە زانکۆ خوێند کار بوو دواتر پرۆگرامێکی بەناوی (گەلی ئیتیکنسۆن) لە پێشکەش کرد لە ڕادیۆی بی بی سی لە ساڵی ١٩٧٩کاری بۆ درامایەک کرد کە ناوی

(هەواڵەکانی کاتژمێر نۆ نیە) تیایدا خۆی ڕۆڵی پاڵەوانیەتی گێرا جگە لەوە ڕۆڵی چیندین درامای تر تەلەفزیۆنی گێڕا تا ئەو کاتەی کەسایەتی مستەربینی داهێنا وە کاتێک شتێکی بە

دڵ نەبێت بە شێوەی کۆمیدی کاردانەوەی دەبێت وەلە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا ڕونی کردەوە کە خواستێکی کەم دوو دابهێنێت چوونکە لەکاتی قسەکردندا زمان دەی گرێت

و بەڕەوانی قسەی نەدەکرد بەتایبەتی ئەو وشانەی بە پیتی (ب) دەست پێدەکەن هەر بەو هۆیەوە زۆرێک لە چاو پێکەوتنی تەلەفزیۆنی رەتکردوەتەوە

ڕوان ئەکتینۆس سەرسام بو بە کەسیەتی (جەیمس بۆند) وە بۆتە پاڵەوانی یەکێک لە فیلمەکانی جەیمس بۆند

وە مستەر بین بەهۆی بەهێزی کەسایەتیەکەی هەڵبژێردرا بۆ کردنەوەی ئۆلۆمپی٢٠١٢ لە لەندەن پێشکەشبکات

وە هیوایەتی ئۆتۆمبێل لێخوڕین بوە وە دەیویست مۆڵەتی شۆفێری بارهەڵگر بەدەست بێنێ

وە لە ئێستادا مستەر بین بە بلیمەت ترین کەسایەتیەکانی جیهان دادەنرێت.



## ئامۆژگاریەکانی جیم کاری

ئەزانی ئاسایە کەهەندێک جار هەستەکان بخۆیتەوە وە ترس کاریگەری لەسەر ژیانت دەبێت بەڵام خۆت دەتوانی بڕیار بدەی چەنێک تەمەنت بە پێشبینیە ناخۆشەکانت بەسەر بەریت و خەمی ڕێگایەکانی داهاتوت بێ بەڵام ئەو شتە ڕاستیە کە لێرەیە ئەو بڕیارەی ئێستا دەی دەی بنچینەی ترسە یان خۆشەویستی

هەندێک ترس لەسەر ڕێگایەکەمان ئەکەینە ڕاستەقینە وە من سەلماندومە کە دەتوانی داوا لە خودا بکەیت تاکو هاوکارتان بێت

باوکم ئەی توانی ببێتە کۆمیدیەکی زۆر گەورە بەڵام بڕوای بەوە نەبوو،

وەمن زۆر زۆر شت لە باوکم فێربووم یاکێک لەوانە کە سەرکەوتوو نابی لە کارێک کە حەزت لێی نیە بۆیە دەبێت ئەو ئیشە بکەیت کە حەزت لیە وە من سەیری باوکمم ئەکرد هەر کۆمیدیایەکەی خۆش ئەویست

وە من وتم ئەوە ئەو شتەیە کە من ئەتوانم بیکەم من خۆم یەکلا کردەوە

ئەی تۆ چی ئەکەی چۆن خزمەتی جیهان ئەکەی؟ وە من بەپێی ئەزمون ئەتوانم بڵێم کە تۆ دەتوانی کاریگەریت هەبێ لەم ژیانە وە هەموو شتی ئەم جیهانە بەدەست دێنی ئەڕزێو لە ناو ئەچێ تەنها ئەوە نەبێت کە لە دڵتایە ،

سەرکەشی بکەن تاکوو ئەو شکۆیەی هەتانە دەرەکەوێ.

# کۆتایی

**زۆر سوپاسی ئەو کەسانە دەکەم کە هاوکارم بوون**